

# ئەم ڕێگایەی بەرەو بەهەشتم ئەبا

نووسین و کۆکردنەوە
ابو عائیشة الكردية

## پێشەکی

(١)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

والصلاة والسلام على أشرف المرسلين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

**أما بعد:**

موسڵمانان به پێویستم زانی باسی بابەتێکی گرینگ بکەم لەسەری قسەبکەم ، کە ئەمڕۆ زۆرینەی بەم بابەتە ناشارەزاین پێی، کە ئەویش تێگەیشتنە لە بابەتێکی زۆرگرینگە(سێ پرسیارەکەی ناو گۆڕ ) وەکو لە فەرموودەی صحیحدا پێمان گەیشتووەکە پێغەمبەرمان دەفەرموێت:

كانَ النَّبيُّ صلَّى اللَّهُ علَيهِ وسلَّمَ: ( إذا فرغَ مِن دفنِ الميِّتِ وقفَ علَيهِ ، فقالَ : استغفِروا لأخيكُم ، وسَلوا لَهُ التَّثبيتَ ، فإنَّهُ الآنَ يُسأَلُ) *

---

صحيح أبي داود *

## (٢)

أمَّا الأسئلة التي يسألها الملكان للميت فهي: من ربّك؟ ما دينك؟ من نبيّك؟ وجواب المؤمن عن الأسئلة الثلاثة التي تُنجِّيه من عذاب القبر هي: ربِّي الله، ديني الإسلام، هو عبدالله ورسوله. أمَّا عن جواب الكافر فيكون: هاه، هاه، لا أدري، وجواب المنافق: لا أدري سمعت الناس يقولون شيئا فقلته.

## واتە:

له پێغەمبەری خوداوە ﷺ :

کاتێک له ناشتنی مردوەکان تەواو دەبوین هەڵدەستا و دەیفەرموو: (دووعای لێخۆشبون بۆ براکەتان بکەن و داوا لە الله بکەن ئەو پسیارانەی لەسەر ئاسانکا کە ئێستا لێی ئەکەن)،

سەبارەت بەو پسیارانەی فریشتەکانیش ئەیکەن بریتیە لە: خودات کێیە؟ ، دینەکەت چیبوو؟ ، پێغەمبەرەکەت کێیە؟

لەوکاتەیا ئیمانداران لە وەڵامدا دەڵێن: خودام الله یە ، دینم ئیسلامە ، پێغەمبەرەکەم محمدە ﷺ،

بەڵام کافرەکان لەوکاتەی پسیاریان لێدەکرێ دەڵێن: ها ، ها ،نازانم، وە مونافیقانیش ئەڵێن: نازانم بەڵام گوێم لە خەڵکی بوو شتێکیان ئەگوت،...]

(٣)

## جا مەبەستم لەو حدیثە چیە؟!

مەبەستم ئەوەیە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم سێ پسیارە دەبێ خۆت ئامادەکردبێ و زانیاریت پێی هەبێ ، دەبێ گوێڕایەڵی فەرمانی الله بوبی بۆ ئەوەی بڵێی خودای من الله یە،

دەبێ لەسەر دین و ڕێباز و یاساکانی ئیسلام ڕۆیشتبی تا بتوانی بڵێی دینی من ئیسلامە،

دەبێ شوێن ئەمر و نەهیەکانی پێغەمبەرەکەت کەوتبی تا بتوانی بڵێی پێغەمبەرەکەم محمد بوە ﷺ ،

جا إن شاء الله لێرەدا هەڵدەستین بەوەی بە پوختی و بە شێوازێکی ئاسان تێتان بگەیەنین کە چۆن بتوانن إن شاء الله بە ئاسانترین شێوە وەڵامی ئەم پسیارانە بدەنەوە...

ابو عائشة الكردية

(٤)

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## پرسیاری یەکەم



إن شاء الله دێینە سەر یەکەمین پرسیار لەو سێ پرسیارەی لەناو گۆڕ لێت ئەکرێ ئەویش (من ربك) واتە خودات کێیە؟؛

پێش هەموو شتێک ئەبێ بزانین ئێمە خودامان الله یە ، وە هەر ئەو بەتاک و تەنیایی ئەپەرستین ، وە لەسەرمان واجبە کە ئێمە شرکی بۆ پەیدا نەکەین وەکو لە حدیثی صحیحدا هاتوە رسول الله ﷺ ئەفەرموێ:

عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ - رضي الله عنه - قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ رَسُولِ اللّٰهِ صلى الله عليه و سلم عَلَى حِمَارٍ يُقَالُ لَهُ عُفَيْرٌ. قَالَ: فَقَالَ: يَا مُعَاذُ! أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللّٰهِ عَلَى الْعِبَادِ وما حقُّ العبادِ عَلَى الله؟ قَالَ قُلْتُ: الله وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «فَإِنَّ حَقَّ اللّٰهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوا اللّٰهِ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً. وَحَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ لاَ يُعَذِّبَ مَنْ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً» *

## واتە:

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی موعاز! ئایا دەزانی مافی خودا چییە لەسەر بەندەکانی و مافی بەندە لەسەر خودا چییە؟

وتم: خودا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن،

فەرموویەتی: مافی خودا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە کە خودا بپەرستن و هیچ شەریکێکی بۆ بڕیار نەدەن، و مافی بەندە لەسەر خودای گەورەوە ئەوەیە بیانکاتە بەهەشتەوە.

* صحیح مسلم

# (٥)

لەم حدیثەدا ئەوەمان بۆ ڕوندەبێتەوە کە تۆ بە یەکخودا پەرستی و بەبێ ئەوەی شرک بۆ الله دروست بکەی بگەڕێیەوە بەردەم الله ، ئەوە الله لە پاداشتی ئەوەدا دەتکاتە بەهەشتەوە.

لێرەدا پسیارێکمان بۆ دروستەبێ؛

ئایا کەسێک گەر شرکی بۆ الله بڕیاردابێ ئەچێتە بەهەشتەوە؟!

## وەڵام/

هەر کەسێک شرکی بۆ الله بڕیاردابێ و بە موشریکی گەڕابێتەوە بەردەم الله ئەوە خودا هەرگیز لێی خۆشنابێ و هەتا هەتایە لە جەهەنەما ئەمێنێتەوە وەکو خودا ئەفەرموێ:

{إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ}*

واتە:

خودا هەرگیز لەو کەسە خۆشنابێ کە شرکی بۆ بڕیارداوە.



* [ النساء - ٤٨ ]

# ( ٦ )

وە هاوبەشیدەران هەتا هەتایی لە دۆزەخ ئەمێنێتەوە،

وە بەڕاستی بابەتی شرک بۆ خودا بڕیاردان زۆر زۆر بابەتێکی مەترسی دارە ،

هەتا الله هەڕەشە لە پێغەمبەرمان محمدیش ﷺ ئەکا کە خۆشەویست ترین

کەسیەتی کە لە پێغەمبەر نوحەوە تاوەکو پێغەمبەرمان محمد ﷺ باسەکا و پێی

دەفەرموێ:

*
{وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ}

**واتە:** (الله سوێندەخوا و ئەفەرموێ) سوێندەخۆم کە بێگومان وەحی کراوە بۆتۆ و ئەو

پێغەمبەرانەی لەپێش تۆوە هاتوون ، گەر بێتو یەک شرکتان بۆ الله بڕیاردابێ ئەوە هەموو

کردەوەکانتان بەتاڵدەبنەوە و لە کۆتایشدا لە لە زەرەرمەندانن،

جا لێرەدا ترسناکی شرکمان بۆ بەدیار ئەکەوێ،

هەموومان ئەزانین پێغەمبەران خۆشەویست ترین بەندەکانی خودان کە لە بەهەشتیش پلەیان

لە هەموو خەڵکی بەرزترە ، وە تۆ بێنە بەرچاوت پێغەمبەر نوح ٩٥٠ ساڵ دعوەی کرد

بۆ یەک خودا پەرستی، گەر بهاتبایە و یەک شرکی بڕیاردابا ، ئەوە هەموو کردەوەکانی

بەتاڵ دەبووەوە ، جا ئێمە دەبێ ئەوە بزانین کاتێک کە کەسێک نوێژ دەکا و ڕۆژو

ئەگرێ و حەج دەکا و زەکات ئەدا و هەرچی کاری چاک هەیە دەیکا ، بەس گەر

هاتو شرکێکی ئەنجامدا ئەوە هەموو کردەوەکانی بەتاڵ ئەبنەوە و لە ڕۆژی دواییش لە

زەرەرمەندانە...

---

* [الزمر - ٦٥ ]

وه لێرەدا پسیارێشکه دروستەبێ:

ئایا شرک لەبەر چی ئاوا گەورەیە و ئەوەندە ترسناکه لای خودای گەورە؟!

له وەڵامدا دەڵێین:

بەڕاستی شرک خراپترین کردەوەیە که خودا ڕقی لێیەتی و وه

له باسی شرکیش ئەفەرموێ:

{إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ } *

واته/ شرک گەورەترین زوڵمه دەرهەق به خودای گەوره بکرێ

لێرەدا دەبێ ئەو پسیاره ئاڕاستەی خۆمان بکەین:

ئایا خودایەک دروستی کردوین و نانمان ئەدا و ئاومان ئەدا و بەخێومان ئەکا ، ئایا

ئێمه دەبێ شرکی بۆپەیدا بکەین ، که وەکو تازه ئایەتەکەمان هێنایەوه که ئەفەرموێ:

شرک گەورەترین زوڵمه دەرهەق به الله بکرێ؟!

لەوەڵامدا دڵمان و مێشکمان جوابمان ئەدەنەوه و ئەڵێن:

(بەئەکید نابێ و ئەوه ئەوپەڕی سپڵەیی و بێفەرمانی و ناکار بەجێییه)

---

* [لقمان - ١٣ ]

## (٨)

**پرسیار/ ئایا ئەم دنیایە شایەنی ئەوەیە کە ئەم بەهەشتە بێکۆتایە لەپێناوی لەدەست بدەین؟!**

**وەڵــام/**

بەدڵنیاییەوە نەخێر ،

وەکو هەموومان ئەزانین کە باوکە ئادەممان لەبەشتەوە دەرکرا و نێردرابۆسەر زەوی بۆ تاقیکردنەوە و وەکو سزایەک ، وە پاشان بۆ بەهەشت گەڕایەوە ، جا ئێمەش ئەبێ بزانین کە ئێمە لە تاقیکردنەوەداین ، وە پێغەمبەرمان ئەفەرموێ ﷺ:

لەڕۆژی قیامەت بەندەکان دێنن و پێیان دەڵێن: ئایە چەند لەدنیادا ژیان؟ ، ئەوانیش دەڵێن نازانین ڕۆژێک بوو یان ڕۆژێک کەمتر،

تۆ سەیری ئەو دنیایە دور و درێژەی کە تێیدا ٧٠ ٨٠ ساڵ ئەژین وەکو ڕۆژێک یاخود کەمتر وابێ؟!

* * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * *

**وە لە حدیثی دیکەشدا هاتوە پێغەمبەرمان ﷺ ئەفەرموێ:**

**عن سَهْلِ بنِ سَعْدٍ السَّاعديِّ قَالَ: قَالَ رَسُول اللَّه ﷺ: لَوْ كَانَت الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللَّه جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْها شَرْبَةَ مَاءٍ. ❋**

**واتە/ ئەگەر دنیا لەلای خودا قیمەتی باڵە مێشێکی هەبایە ئەوە یەک قوم ئاوی نەدەدا بە بێباوەڕان و موشریکەکان.**

ئێستا پرسیار لەخۆتکە ، ئایە ئەو دنیا بێ قیمەت و کەم و هیچە شایەنی ئەوەیە بەهەشتی بێکۆتای لەپێناودا دابنێی؟

- - - - - - - - - - - - - - - - - - - - - - -

❋ إسناده صحيح أو حسن أو ما قاربهما] | التخريج : أخرجه الترمذي واللفظ له، وابن ماجه.

(٩)

## ئایا شرک بەس ئەوەیە کە بڵێی غەیری خودا ئەپەرستم؟!

## وەڵام/

نەخێر بەڵکو شرک بەجدی زۆر زۆر ترسناکە و شایەنی ئەوەیە لێی بترسی لەبەر ئەوەی زۆر زۆر شاراوەیە،

هەروەک لە فەرموودەدا هاتوە

پێغەمبەرمان ﷺ بە ابو بکر(رضی الله عنه) ئەفەرموێ:

{الشرك أخفى فيكم من دبيب النمل} *

واتە: شرک لە مێرولەیەک شاراوەترە و نازانی چۆن توشی ئەبی.

* * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * *

وە ئەفەرموێ ﷺ :

{يصبح الرجل فيها مسلمًا ويمسي كافرًا،

ويمسي مؤمنًا، ويصبح كافرًا} *٢

واتە: ڕۆژانێک بەسەر خەڵکی دادێ ، پیاو بەیانی دەکاتەوە موسڵمانە و ئێوارە دەکاتەوە بێباوەڕە(کافرە) ، یان ئێوارە دەکاتەوە موسڵمانە و بەیانی دەکاتەوە بێباوەڕە(کافرە)

ئەم سەردەمەش ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمبەرمان لەو حدیثەی سەرەوەدا باسیکردوە ، ئەبینین کە کابرا بەیانی موسڵمانە و ئێوارە لەبەر پارەیەکی کەم ، یاخود بوجەیەکی کەم ، یاخود ئافرەتێک ، یاخود ناوبانگێک دینی فرۆشتوە و کافربوە...

---

* صحيح

*٢ صحيح] - [رواه مسلم]

(١٠)

# ناسینی پەروەردگار

من ربك؟!

لە پێشتردا زانیمان کە ئێمە گەر بمانەوێ بڕۆینە بەهەشتەکەی پەروەردگار نابێ هاوبەشی بۆ بڕیار بدەین، جا لێرەدا إن شاء الله زیاتر دەچینە سەر ناسینی خوداکەمان کە الله یە.

**پرسیار/** گەر پرسیارمان لێکرا خودات کێیە دەڵێین چی؟

**وەڵام/** خودای من الله یە و خاوەن و بەڕێوەبەری هەموو گەردوونە.

* * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * *

**پرسیار/** گەر لێیان پرسی خوداکەت بەچی دەناسیەوە؟!

**وەڵام/** خوداکەم (کە الله یە) بە ئایەتەکانی و دروستکراوەکانی دەناسمەوە (واتە: تۆ گەر بتەوێ گەورەی و بەدەسەڵاتی خودات بۆدەرکەوێ ئەوە دەچی لە ئایەتەکانی ئەڕوانی و سەیرەکەی هیچ هەڵەیەکی تێدانیە ، یاخود ئەڕۆی لە دروستکراوەکانی ئەڕوانی و ئەزانی کە گەورەیی ئەو الله یە چەندە، وەکو چۆن لە سورەی الملك ئەفەرموێ:

{ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ} *

**واتە:** ئەو خوایەی کە حەوت چینی ئاسمانی بێ کەم وکوڕی لەسەر یەك بەدیهێناوە و تۆ هیچ ناتەواوی و ناڕێکیەك لە بەدیهێنراوی خوا نابینی، دیسانەوە چاوبگێڕەوە بۆ ئاسمان و تەماشابکە ئایە هیچ درز و شەقێك لە ئاسمان ئەبینی؟

* الملك ـ ٣

(١١)

{ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ}*

واتە:

پاشان جار لە دوای جار بڕوانەوە بۆ ئاسمان و بڕوانەوە، دەبینیت بە زەلیلی و ملکەچی و ماندوویی چاوت دەگێڕیتەوە بە بێ ئەوەی ناتەواویەك ببینی (لە دروستکراوەکانی الله).

📌لەم ئایەتەدا گەورەیی و بەدەسەڵاتی خودامان بۆ دەرئەکەوێ کە هیچ کەم و کوڕیەک لە دروستکراوەکانی نییە...

پرسیار/

گەر لێیان پرسی ئایا خودا لەکوێیە؟!

وەڵـام/

دەڵێی: خودای من لەسەر عەرشە ، وەکو چۆن الله ئەفەرموێ:

{ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ}*٢

پرسیار/ ئایا عەرشی الله لەکوێیە؟!

وەڵـام/ لەسەروی حەوت تەبەقەی ئاسمانە

إن شاء الله زیاتر لە ناسینی ئیسلام و فێربونی تەوحید زیاتر لە ناسینی الله تێئەگەین...

- - - - - - - - - - - - - - - - -

* الملک - ٤

*٢ طه - ٥

بنچینه و پرسیاری یەکەم؛

## (ما دینك) دینەکەت چیە؟!

لە بنچینەی دووەم لە سێ پسیارەکەی ناگۆڕ کە لێمان ئەکرێ بریتیە لەوەی (دینەکەت چیە؟ پێش هەموو شتێک دەبێ بزانین دینی ئێمە ئیسلامە.

جا لێرە پرسیارێک دروستەبێ ، ئایا مانای ئیسلام چیە؟!

## وەڵام/

{الإسلام: وهو الإستسلام لله بالتوحيد والانقياد له بالطاعة والبراءة من الشرك وأهله}

واتە: ئیسلام، بریتیە لە تەسلیمبون و ملکەچ بوون بۆ خودای گەورە بە تەوحید ، وە لە ڕێگەی گوێڕایەڵیەوە ملکەچی ئەبی(واتە: بەپێی ئایەت و حدیث گوێڕایەڵی ئەبی ، و نە هیچ شتێک لە دین کەم ئەکەی نە زیادی ئەکەی) ، وە خۆ بێبەری کردنە لە شرک و لەو کەسانەش کە شرک ئەنجام ئەدەن.

لێرەدا بابزانین مەبەست چیە لەوەی بەتەوحید ملکەچی الله بین؟!

## بابێین بزانین پێناسەی تەوحید چیە؟!

# (التوحيد هو إفراد الله بعبادة)

بریتیە لە بەتاک دانانی الله لە بەندایەتیدا و هیچ شرکێکی بۆ دروست نەکەین لە هیچ بەشێک لە بەشەکانی تەوحید.

# (١٣)

## تەوحید و بەشەکانی:

پرسیار/ ئایا تەوحید دەبێ بەچەند بەشەوە؟!

وەڵام/ تەوحید ئەبێ بە سێ بەشەوە ؛

١ - التوحيد الربوبية (بەتاک دانانی الله لە پەروەردگاریەتیدا)

٢ - التوحيد الألوهية (بەتاکدانانی الله لە پەرستندا)

٣ - التوحيد الأسماء والصفات (بەتاک دانانی الله لە ناو و سیفاتەکانیدا)

ئێستا دێینە سەر جۆرەکانی تەوحید:

## یەکەم جۆری تەوحید (التوحيد الربوبية)

لێرەدا دەبێ بزانین بەس الله (رب) و دەبێ بەس ئەو بپەرستین لە رەبییەتدا،

واتە دەبێ بزانین کە:

١ - بەس الله خالقە و دروستکەری ئەم گەردونە و ئەوەی ناویەتی...

٢ - بەس الله رازقە و ڕۆزی دەرە و هیچ هاوبەشێکی نیە و ڕزقمان تەنیا بەدەس الله یە...

٣ - بەس الله دەمان ژیەنێ و دەمان مرێنێ و ژیان و مردنمان هەر بەدەست ئەوە و تا ئەو ویستی لێنەبێ کەس ناتوانێ ڕۆحمان دەربکا...

٤ - ئەوەی لەسەر ئەم زەویە و لەناو ئەم گەردونەیە هەمووی موڵکی الله یە و
هیچ هاوبەشێکی نیە ، و ئەوەی هەیە عبد و دروستکراوی ئەون...

٥ - خودا ئاگەدارە بە هەموو شتێک کە لەم زەمین و گەردونە ڕوئەدا و هەتا
بگرە بە ئاگایە بە جوڵەی گەردیلەکان و ئەو وەس وەسانەی بەدڵمان
دادێ...

٦ - ئەبێ بزانی کە حوکم و حاکمیەت تەنیا موڵکی الله یە و موڵکی عبد
نیە، هیچ کەسێک بۆی نیە حوکم و شەرع دانێ و حوکمی الله
بگۆڕێ ، وە دەبێ بە غەیری یاسای الله ڕازی نەبی و دژیبی و دژیشی
بوەستیتەوە وەکو یاساکانی دیموکراسی و ، علمانیەت و شوعیەت و هەموو
یاسایەکی بەشەریەت کە دایاننناوە...

وە لێرەدا تەوحیدی ڕبوبیەتمان بۆ ڕون ئەبێتەوە ، کە ئەبێ ئەوەش بزانین
کە هەرچی لەسەر ئەم زەمینەیە موڵکی الله یە لە ڕوی بەڕێوەبردندا.

ئینجا دێینە سەر دووەم جۆری تەوحید کە تەوحیدی ئولوهیەتە

التوحید الألوهیة (واتە بەتاکدانانی الله لە ئیلاهیەتدا)،

تەوحیدی ئولوهیەت بریتیە لەوەی کە تۆ تەنها الله ئەپەرستی لە ئیلاهیەتدا، واتە نابێ لە عیبادەتەکانت هیچ خودایەشکە بکەیتە شرک لە پەرستن و عیبادەتدا...

تۆ دەبێ هەموو عیبادەتێکت تەنیا بۆ الله بێ،

بۆ نموونە: تۆ دەبێ نوێژ و ڕۆژو خێر و چاکەکردن و قوربانیەکت تەنیا بۆ الله بێ ، نابێ هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار بدەی(بگرە نابێ پێغەمبەر محمدیشﷺ بکەیە هاوبەشی کە خۆشەویست ترین کەسی خودایە) ، دەبێ ترس و داوا و پاڕانەوەکانت تەنیا و تەنیا بۆ الله بێ.

**وە لێرەدا تەوحیدی ئولوهیەتمان بۆ بەدیار ئەکەوێ کە: (دەبێ تەنیا و تەنیا بەندایەتی و ترس و داوا و چاکە و خێرێکت بۆ الله بێ).**

## پاشان دێینە سەر سێیەم جۆری تەوحید کە تەوحیدی ناو و سیفاتەکانی خودایە

التوحيد الأسماء والصفات (واتە: بەتاک دانانی خودا لە ناو و سیفاتەکانی)،
لەم تەوحیدەدا دەبێ الله سبحان وتعالی لە هەموو ناو و سیفاتەکانی بەتاک دابنێین ،
وە دەبێ بزانین الله لە بەرزترین پلەیە و لە پلەی (الاعلی) یە و هاوشێوەی هیچ دروستکراوێکی نیە لە شکڵ و شێوەدا ، هەروەکو ئەفەرموێ:

{لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ } *

{هیچ شتێک نیە لە وێنەی ئەو خوایە (نە لە زاتیا، نە لە سیفاتیا، نە لە کرداریا) و ئەویشە بیسەر و بینەرە}

واتە دەبێ خودا بە هیچ دروستکراوێک نەشوبهێنین و خودا بە پاکی ڕابگرین، هەروەکو موجەسیمە و موشبهە (دوو گروپی گومڕای کافرن کە لاشەیان لە مێشکی خۆیان بۆ الله دروست کردوە و یان الله یان بە دروستکراوەکانی چواندوە،

وە دژی ئەوەش دەبێ ناو و سیفاتەکانی الله جێگیر بکەین نەک بیگۆڕین و تەرکی بکەین ، هەر وەکو ئەشعەریەکان و ماتوریدی و موعتەزیلەکان...

واتە: لە عەقیدەی ئەهلی سوننە (ئەهلی سوننە ئەو کەسانە ئەگرێتەوە کە شوێن بیر و باوەڕی پێغەمبەر محمد ﷺ کەوتون بەبێ هیچ زیادکردن و کەمکردنێک لە دین و داهێندراوێک) ، هەموو ناو و سیفاتەکانی الله جێگیر ئەکەن ، بەڵام بە هیچ دروست کراوێکیشی ناشوبهێنن...

(واتە: بۆنمونە لە ئایەت و حدیثدا هاتوە کە الله سبحان وتعالی دەست و قاچی هەیە ، ئەهلی سوننە ئەوە جێگیر ئەکەن و ئەڵێن الله دەست و قاچی هەیە ، بەڵام دەڵێن ئێمە نازانین کە شێوەی چۆنە ، وە بیرکردنەوە لە شێوەی دەست و قاچی الله ئەوە بیدعەیە و پسیارکردنیش لێی بیدعەیە ، لەبەر ئەوەی نە پێغەمبەرمان ﷺ باسی کردوە ، نە سەحابەش پسیاریان لێی کردوە.
ئەمەش سێ جۆرەکەی تەوحید بە کورتی..

* [الشورى - ١١]

وە ئەوانەی ئەمڕۆ بەزۆری لە دوو بابەتدا توشی شرکبون و تێکەوتون، ئەوانیش:

١ـ تەوحیدی ئولوهیەت

٢ـ تەوحیدی حاکمیەت

## یەکەم/

ئەوانەی تێکەوتون لە تەوحیدی ئولوهیەت:

ڕۆژانە ئەبینی لە چەندین شوێن و کاتەوە خەڵکی نوێژەکا و ڕۆژو ئەگرێ و عیبادەت ئەکا ، بەڵام لەم تەوحیدەدا تێکەوتوە کە دەبینی دەڕوا هاوار بۆ قەبرێک ئەکا ، یاخود هاوار بۆ شێخێک یاخود سەرۆکێک یاخود پێغەمبەرێک یاخود پیاو چاکێک ئەکا...

یاخود ئەبینی قوربانی و خێر و سەدەقە بۆ پێغەمبەر یاخود شێخێک ئەکا و ئەیکاتە شرک لەگەڵ خودای گەورەدا ، یاخود ئەبینی ئەوەندەی ئەترسێ لە مرۆڤێک ، یاخود وڵاتێک ، یاخود هەر شتێکی تر... ، ئەوەندە ناترسێت لەخودا،

ئەبینی ئەوە لەو بابەتانەدا توشی شرک بوە ، وە دڵنیاشبن ئەم نوێژ ڕۆژو عیبادەتانە بەکەڵکی نایەت، لەبەر ئەوەی وەکو لە سەرەتای نامیلکەکەدا باسمانکرد کە کەسێک شرکی ئەنجامدا ئەوە هەموو کردەوەکانی بەتاڵ ئەبێتەوە...

---

## دووەم/

ئەو کەسانەی کە تێکەوتون لە توحیدی حاکمیەتا:

وەکو چۆن ٣ جۆری تەوحیدمان باسکرد ، بەهەمان شێوە ئێستا تەوحیدی حاکمیەتیش باسەکەین ، تەوحیدی حاکمیەت بریتیە لەو تەوحیدەی کە دەکەوێتە ژێر ڕکێفی هەرسێ تەوحیدەکەوە...

بۆنموونە:

١ـ لە تەوحیدی ڕبوبیەتا باسمانکرد کە دەبێ حوکم تەنیا هی الله بێ و حوکمی الله لەسەر زەوی جێبەجێ بکرێ،

٢ـ وە لە تەوحیدی ئولوهیەتدا باسمانکرد کە دەبێ عیبادەت تەنیا بۆ الله بێ ، جێبەجێکردنی حوکمی الله ش عیبادەتە ، بۆیە دەبێ حوکمی سەر زەوی تەنیا بۆ الله بێ و نابێ لە غەیری حوکمی الله جێبەجێ بکرێ چون لە غەیری حوکمی ئەو ئەبێ بە شرک،

٣ـ وەکو زانیمان کە لە تەوحیدی ناو و سیفاتەکاندا نابێ هیچ شرکێک بۆ الله دابندرێ ، وە وەکو هەمووشمان ئەزانین یەکێک لە ناوەکانی خودا (الحکم)ـە ، هەر بۆیەش تەنیا ئەو شایەنی حاکمیەتە و حوکم ڕانی تەنیا شەیستەی ئەوە، بۆیەش خودا ئەفەرموێ:

أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ[التين ٨

**واتە:** ئایە خودا لە هەموو حاكمێک حاكمتر نیە!

بەئەكید بەڵێ،

كەواتە چۆن ئەبێ غەیری حوكمی الله جێبەجێ بكرێ؟!

وە ئەفەرموێ:

{فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ} *

**واتە:**

خودا سوێند بەخۆی ئەخوا و ئەفەرموێ: ئەی محمدﷺ سوێند بە خودا نابنە باوەڕدار(واتە هێشتا موسڵمان نابن) تا لە هەموو كار و كردەوەكانیاندا تۆ نەكەن بە حاكم و دادوەر (بەئەكید هەموومان ئەزانین كە پێغەمبەرمانﷺ نێردراوی الله یە و بە حوكم و یاساكەی ئەو حوكم ئەكا)

وە لە ئایەتەكی تر الله جل جلە دەفەرمووێ:

{وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ} *٢

**واتە:**

هەر كەسێک بەو حوكم و یاسایە كارنەكا كە خودا ناردوێتی ئەوە لە كافران و بێباوەڕانە

لێرەشدا ئەوەمان بۆدەركەوت كە كاركردن بە غەیری و حوكم و یاسای الله ئەوە كوفرە و ئینسان ئەگەر موسڵمانیش بێ بە ئەنجامدان یان ڕازیبون بە غەیری حوكمی خودا ئەوە پێی كافر ئەبێ،

ئەمڕۆش ئەبینین زۆرینەی زۆری خەڵک توشی ئەو كفرەبونە و ئەڕۆن دەنگ ئەدەن بە حیزبێكی عەلمانی یان دیموكراسی یان دكتاتۆری یان شوعیەت ، كە وشەی علمانی واتا بێدینی ، كە ئەو حیزبانەی ئەمڕۆش ئەڵێن ئێمە علمانین خۆیان یەكلایی كردۆتەوە كە بێدینن ، جا با هەر بانگەشەی نوێژ و ڕۆژو بكەن...

وە ئەوانەشی ئەڕۆن دەنگەدەن ئەبێ بزانن كە چی ئەكەن،

تۆ كە ئەڕۆی دەنگەدەی بە حیزبێكی عەلمانی پێش هەموو شتێک ئەبێ بزانی كە تۆ دەنگەدەی بۆ جێبەجێكردنی یاسایەک كە ئەڵێ الله نابێ حوكمكا لەسەر زەوی و نەیزانیوە حوكم دانێ،

پاشان دەبێ بزانی كە هەر تاوانێک بكا ئەوە تۆش لەگەڵی بەژداری ، جا زینا حەڵاڵكا تۆش بەژداری لەو حەڵاڵكردنە ، موسڵمان ئەكوژێ تۆش بەژداری لەو قەتلە ، دزی ئەكا تۆش بەژداری لەو دزیە ، ڕیبا حەڵاڵ ئەكا تۆش بەژداری لەو ڕیبایە ، تا دوایی...

---

[النساء - ٦٥] *

[المائدة - ٤٤] *٢

(١٩)

ئایا تۆ تا ئێستا ئەوەت زانیوە؟!

گەر ئەوە ئەزانی و هێشتا سوری لە دەنگدان ئەوە بزانە کە تۆ نوێژ و ڕۆژو چاکەکانت هیچی سودی بۆت نیە چونکە تۆ دژی خودا و دینەکەی و رسولەکەی وەستاویتەوە،

{أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ} *

ئایا حوکم و یاسای جاهیلیەتی بەر لە ئیسلامتان ئەوێ؟!

{وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ}*٢

جادەبێ حوکم و یاسای کێ باشتربێ لە حوکم و فەرمانی خودا بۆ کەسانێک کە شک و گومانیان نیە و ئەهلی یەقینی تەواون(ئەوانەی موسڵمانن)

لێرەوەش بۆمان ڕۆنبۆیەوە کە مانای ئیسلام و تەوحید چیە و جۆرەکانی تەوحیدمان بۆ ڕونبۆیەوە، پاشان با زیاتر دەربارەی ئیسلام بزانین،

ئاینی ئیسلام لە سێ پلەی تەواوکەری یەکتر پێکهاتوە وەکو لە حدیثی جبریدا هاتوە:

يا محمد أخبرني عن الإسلام " ، فقال له : ( الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله ، وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة ، وتصوم رمضان ، وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا ) ، قال : " صدقت " ، فعجبنا له يسأله ويصدقه ، قال : " أخبرني عن الإيمان " قال : ( أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر ، وتؤمن بالقدر خيره وشره ) ، قال : " صدقت " ، قال : " فأخبرني عن الإحسان " ، قال : ( أن تعبد الله كأنك تراه ، فإن لم تكن تراه فإنه يراك ) *٣

---

[المائدة - ٥٠] *

[المائدة - ٥٠] *٢

[رواه - مسلم و بخاری] *٣

# (٢٠)

ئەم حدیثە زۆر ناسراوە و بە حدیثی جبریل(علیە السلام) بەناوبانگە ، کە جبریل دێتە لای رسول الله ﷺ لەسەر شێوەی ئینسان و پسیاری لێدەکا و دەفەرموێ:

ئەی محمد هەواڵم پێبدە لەسەر ئیسلام،

پێغەمبەرمان پێی ئەفەرموێ: ئیسلام پێکهاتوە لە هەردوو شەهادەکە(أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد ان محمد رسول الله) ، وە کردنی نوێژ ، وە زەکاتدان ، وە گرتنی ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان ، وە کردنی حەج و ماڵی خودا،

پاشان جبریل پێی ئەفەرموێ ڕاستت گوت،

پاشان پێی ئەفەرموێ هەواڵم پێبدە دەربارەی ئیمان،

پێغەمبەرمان ﷺ ئەفەرموێ:

بریتیە لە باوەڕ هێنان بە خودا و مەلائیکەت و کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و باوەڕبون بە قەدەری خودا بە خێر و شەڕی،

پاشان جبریل ئەفەرموێ ڕاستت گوت،

هەواڵم پێبدە دەربارەی ئیحسان،

پێغەمبەرمان ﷺ ئەفەرموێ:

بریتیە لەوەی کە تۆ خودا بپەرستی وەکو ئەوەی ببیینی،

وە ئەگەر نەگەیشتی بەو دەرەجە بەرزە، ئەوە خودا ئەپەرستی وەکو ئەوەی تۆ ببینێت(مەبەست لێی ئەوەیە کە تۆ ئەوەندە ئیمانت بەرزبۆتەوە کە وەکو ئەوە وایە تۆ لە عیبادەتەکانت خودا ببینی ، ئەوەندە بە جوانی و بە ڕێک و پێکی و بەئاگاییەوە عیبادەتەکانت ئەکەی).

## لەو فەرمودەیەدا ، هەرسێ پلەکەی ئیسلامان زانی ، ئێستا بابزانین پایەکانی ئیسلام و ئیمان چین...

## یەکەمیان ئیسلام:

~~~~~~~~~~~~

**ئیسلام لە ٥ پایەی سەرەکی پێکهاتوە ، ئەوانیش؛**

١ـ دوو شاهێدی دانەکە کە ئەوانیش (لا إله إلا الله محمد رسول الله)

٢ـ کردنی هەر ٥ نوێژە واجبەکە...

٣ـ پێدانی زەکات (واتە زەکاتدان)

٤ـ ڕۆژو گرتنی مانگی ڕەمەزان

٥ـ حەج کردنی ماڵی خودا

## دووەم ئیمانە:

~~~~~~~~~~~~~~~~

**کە پێکهاتوە لە ٦ پایە ، ئەوانیش؛**

١ـ باوەڕبوون بە خودا(الله)

٢ـباوەڕبوون بە مەلائیکەتەکان

٣ـباوەڕبوون بە کتێبە ئاسمانیەکان

٤ـباوەڕبوون بە پێغەمبەران

٥ـ باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی

٦ـباوەڕبون بە قەدەری خودا (بە قەدەری خێڕ و شەڕی)

# (٢٢)

ئێستا بابێینە سەر یەکەم پایەی ئیسلام کە دوو شاهێدیەکەیە ، بابزانین ئەو دوو شاهێدیەمان چۆن لێ وەرەگیرێ...؟

پێش هەموو شتێک کەسێک کە بێباوەڕ(کافر)بێت و بێتە ناو ئیسلام بەم دوو وشەیە موسڵمان ئەبێ، جا با بزانین چۆن بەم دوو وشەیە موسڵمان ئەبێ ،

وە بزانین ڕوکن و مەرجی قبوڵبونی ئەم دوو وشەیە چیە؟!

وە هەڵەوەشێنەرەوەکانی ئەم دوو وشەیە چینە...

## یەکەم شایەتی کە ئێمە بیدەین لا إله إلا الله یە،

## پێش هەموو شتێک با بزانین لا إله إلا الله مانای چیە؟!

شێخ ئەلبانی ئەفەرموێ: واتە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستنبێ بە حەق جگە لە الله، (خۆی لە دنیادا پەرستراو زۆرن ، بەڵام هەموویان بەتاڵ و پوچن تەنیا یەکیان نەبێ ، ئەویش (الله)یە ، تۆ سەیریکە هەیە بتەپەرستێ ، هەیە قەبر ئەپەرستێ ، هەیە عیزێیکی غەیرەدین ئەپەرستێ ، هەیە پارە ئەپەرستێ، هەیە سەرۆکێک ئەپەرستێ)، بەڵام ئایە ئەوانە هەموویان خودای حەقن؟

بەئەکید نەخێر و تەنیا الله ڕاستە،

بۆیە ئەبێ بڵێین لا إله إلا الله واتە: (هیچ خودایەک بە حەق نیە شایستەی پەرستن بێ جگە لە الله)

## پاشان بابزانین لا إله إلا الله لە چەند ڕوکن پێکهاتوە؟

**لا إله إلا الله لە ٢ ڕوکن پێک هاتووە؛**

## ١ـ النفي (واتە: خۆ بێبەریکردن)

## ٢ـ الإثبات (واتە جێگیرکردن)

یەکەم النفي/ بریتیە لە خۆ بێبەریکردن لە هەرچی خودایەکە کە ئەپەرسترێ و کافربون پێیان (تێبینی: وشەی کافر واتە بێباوەڕ ، و کافربی پێیان واتە بێباوەڕبی پێیان)

## بەڵگەمان چیە؟!

### خودای گەورە ئەفەرموێ:

{وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ}*

واتە:

بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، و خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر

وە ئەفەرموێ:

{فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ}*٢

واتە:

جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە تاغوت (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە(کە بریتیە لە لا إله إلا الله).

لەم ئایەتەدا ئەوەمان بۆ ڕوون بۆوە کە تا کافرنەبین بە طاغوت و کفریان پێنەکەین ئەوە نایەینە ناو بازنەی ئیسلامەوە.

---

* [النحل ـ ٣٦]

٢* [البقره ـ ٢٥٦]

## ئا ئێستا بزانین طاغوت چیە؟!

(٢٤)

طاغوت بریتیە لە هەر کەس و شت و ڕێباز و یاسایەک کە بپەرسترێ ، یاخود بڵێین بکرێتە هاوبەشی خودا لەو شتانەی کە تەنیا موڵکی خودایە.

## ئێستا بابزانین طاغوتەکانمان کێن؟!

طاغوتمان زۆرن ، بەڵام سەرانی طاغوتەکان ٥ جۆرن(واتە هەموویان لەژێر ئەو پێنجە کۆئەبنەوە)

### یەکەم جۆری طاغوت/

شەیطانە کە بانگەوازەکا بۆ شیرک و بێباوەڕی...

بەڵگەش لەسەر ئەمە (سورةی یس ئایەتی ٦٠)

### دووەم جۆری طاغوت/

ئەو کەسەیە کە حوکم بە غەیری حوکم و یاسای خودا ئەکات...

بەڵگەش لەسەر ئەمە (سورةی المائدة ئایەتی ٤٤)

### سێیەم جۆری طاغوت/

ئەو کەسەیە کە ئەپەرسترێ و پێی ڕازیە...

بەڵگەش لەسەر ئەمە (سورةی الأنبیاء ئایەتی ٢٩)

### چوارەم جۆری طاغوت/

ئەو کەسەیە کە بانگەشەی زانستی شاراوە(علم اللغیب)ئەکا (کە ئەمە تەنیا پەیوەستە بە الله وە و جگە لە الله کەس نایزانێ...)

بەڵگەش لەسەر ئەمە (سورةی النمل ئایەتی ٦٥)

### پێنجەم جۆری طاغوت/

بریتیە لەو کەسەی کە جادو سعر ئەکات ،(ئەوەش جۆرێکی ترە لە جۆرە سەرەکیەکانی طاغوت کە لەم سەردەمەدا زۆر باوە)

بەڵگەش لەسەر ئەمە (سورة البقرة ئایەتی ١٠٢)

ئەمانە ئەو پێنج جۆرە سەرەکیەی طاغوتن ، کە بەسەرانی طاغوت ناودەبرێن ، جا بۆیە موسڵمان ئەبێ شارەزایانبێ ، بۆئەوەی شوێنیان نەکەوێ و نەبێتە بەندەی ئەوانە ، لەبەر ئەوەی گەر شوێنی ئەوانە کەوتی ئەوە توشی شرک ئەبی و هەموو عیبادەتەکانت بەتاڵ ئەبێتەوە...

## باشە چۆن کفر بە طاغوت بکەین؟!

کفر بە طاغوت بە ٣ هەنگاو ئەکرێ:

١- دەبێ لە دڵتا ڕقت لێیانبێ و بە دوژمنی خۆتیان بزانی

٢- دەبێ ئەوەندەی لەتواناتدا هەیە بەدەم دژیان بوەستی

٣-ئەگەر لە تواناتداهەبو دەبێ بە کردەوەش لەدژیان بوەستی و دژایەتیان بکەین،

بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەم ئایەتەی الله یە کە ئەفەرموێ:

{قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ}

ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو

{إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ}

کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن

(٢٦)

{كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ}*

واتە: بێباوەڕین پێتان ، وە لەنێوان ئێمە و ئێوەدا ڕق و کینە و دژایەتیەکی زۆر هەیە ، تاوەکو ئیمان بە الله ی تاک و تەنیا ئەهێنن(واتە هەر کەسێک موشریکبێ ئەوە دوژمنمانە و ڕق و کینە لە دڵماندایە بەرامبەریان)

📌 جا لە یەکەمی ئەم ئایەتە جوان دیقەت بدەن ، خودای گەورە پێغەمبەر ئیبراهیمی کردە قودوە و پێشەنگمان ، ئێمەش ئەبێ چاوی لێبکەین ، واتە لەنێوان ئێمە و ئەو کەسانەی کە شرکیان بۆ خودا بڕیارداوە هیچ خۆشەویستیەک نیە ، ئەوەش پێی ئەوترێ ولاء و براء کە إن شاء الله دێینە سەری ، واتە ئەبێ بزانین ، ئێمە دەبێ بەریبین لە طاغوتەکان ، وە لەو کەسانەش کە شوێنی طاغوتەکان کەوتون و شرکیان بۆ الله بڕیارداوە ، وەدەبێ ڕق و کینە و دوژمنایەتی لە نێوانماندابێ ، تا ئیمان بە خودا دێنن بەبێ ئەوەی شرکی بۆ پەیدابکەن،

🪧 جا پاشان دێینە سەر دووەم بڕگەی لا إله إلا الله کە جێگیرکردن(الإثبات)ـە،

واتە تۆ ئێستا کفرت بە هەموو خودایەکی بەتاڵ کردوە کە هەیە ، وە ئێستا ئەبێ ئیمان هێنانت بە خودای حەق کە الله یە جێگیر بکەی و ئیمان بە الله بێنی، وە ئیمان هێنان بە الله ش بە هەرسێ جۆرەکەی تەوحیدە کە پێشتر باسمانکرد و نابێ شرکی بۆ بڕیار بدەی

[الممتحنه ـ ٤] *

(٢٧)

## ئێستاش بێین باسێکی ولاء و براء بکەین:

**١- ولاء/ بریتیە لە خۆشەویستی لە پێناو خودا**

**٢- براء/ بریتیە لە ڕقلێبونەوە لەپێناو خودا**

ولاء و براء زۆر زۆر ئەساسە لە دیندا ، بگرە بناغەی دینە و ئیسلام لەسەر ئەم دوو وشەیە پێکهاتوە،

ولاء و براء واتە: دەبێ هەموو خۆشەویستی و ڕقلێبونەوەیەکت لەپێناو خودابێ نابێ کافرت خۆشبوێ گەر باوک و برای خۆتبێ ، دەبێ موسڵمانیشت خۆشبوێ گەر عەبدێکی حەبەشی ڕەشپێستبێت...

هەر وەک الله تعالی ئەفەرموێ:

{لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ} ❋

**واتە:**

نایبینیەوە لەنێو قەومێک کە ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هێنابێ ، ئەو کەسە بێت و دۆستایەتی کەسانێک بکا کە دوژمنایەتی خودا و پێغەمبەرەکەی بکەن ﷺ ، ئەگەر ئەو کەسانە باوکیانبن ، یاخود کوڕیانبن ، یاخود برایانبن ، یاخود یەکێکبن لە عەشیرەتەکەیان،(تۆ سەیری لێرەدا الله هەموو کەسە گرینگرکانی هێناوەتەوە ، بۆ ئەوەی بە هیچ شێوەیەک مەیلت بەلای کافران نەڕوات)، پاشان ئەفەرموێ لە تەواوکەری ئایەتەکە: ئا ئەو کەسانە الله ئیمانی لەدڵیان جێگیر کردوە و چەسپاندوە و جێگیریکردوە لە بەهرە و میهرەبانی تایبەتی خۆی.

---

❋ [المجادلە - ٢٢]

(٢٨)

پاشان بۆ زیاتر دڵنیابونەوە لەوەی گەر بێت و کافرمان خۆشبوێ ئەوە لەوان حیسابین لە قیامەت ئەو ئایەتەی الله ئەهێنینەوە کە ئەفەرموێ:

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا } *

واتە:

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بێ باوەڕان مەکەنە دۆست و یاوەری خۆتان لەجیاتی ئیمانداران، ئایا دەتانەوێت بە دەستی خۆتان بەڵگەیەکی ئاشکرا بدەنە دەست خوا لەسەر خۆتان(واتە بەدەستی خۆتان بەڵگەی ئاشکرا بدەنە دەستی خودا لەسەر کافربونتان؟)

وە ئێستاش بەداخەوە زۆرێکمان ئەبینین کە کەسانێک هەن بە ناوی وەرزشی و وەرزش دۆستی یان بە هەر ناوێشکەبێ ، مرۆڤایەتی یان نازانم چیبێ ، ئەبینین یاریزانەکانی یەهود و نصارایان خۆشەوێ ، یاخود وڵاتێکی کافریان خۆشەوێ ، یاخود هەر بابەتێکی تر لەوانە...
و لێرەشا الله ئاگەدارمان ئەکاتەوە و ئەفەرموێ:

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ} *٢

واتە:

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە دۆست و یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت و کافرە وەکو ئەوان) بەڕاستی خوا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات...

لێرەدا زۆر بە وردی ولاء و براء(خۆشەویستی و ڕقلێبونەوە لە پێناو خودا)مان بۆ ڕون ئەبێتەوە ، تێئەگەین گەر بێت و کافرمان خۆشبوێ و دڵخۆشبین بە سەرکەوتنیان و ڕقمان لێیان نەبێ ئەوە پێی کافر ئەبین و لا إله إلا الله یەکەمان هەڵدەوەشێتەوە.

---

* [النساء - ٤٤]

*٢ [المائیدة - ٥١]

(٢٩)

## پاشان دێنە سەر مەرجەکانی لا إله إلا الله کە هەشت مەرجن

پێش هەموو شتێک ئەهلی عیلم دەفەرموون :

ئەو کەسەی بە تەنها دەڵێت {لا إله إلا الله}

هیچ سودێک بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت تەنها کاتێک ئەو مەرجانەی تێدا کۆدەبێتەوە .

## [ مەرجەکانیش بریتین لەمانە ]

① مەرجی یەکەم : زانین ( العلم ) :

واتە : عیلم و زانیاریت هەبێ بە مانا و مەبەستەکانی ، وە بزانیت چی نەفی ئەکات وە چی جێگیر ئەکات .

② مەرجی دووەم : دڵنیابوون و بێ گومانی ( اليقين ) :

ئەو کەسەی دەڵێت لا إله إلا الله

دەبێت بێ گومان بێت و دڵنیابێت لەوەی کە دەیڵێت لا إله إلا الله جا ئەگەر هاتوو گومانی هەبوو لەوەی کە دەیڵێت ئەوا هیچ سوودی نییە بۆی .

③ مەرجی سێیەم : ڕازی بوونە پێی (القبول) :

دەبێت ڕازی بیت بەوەی کە ئەو وشەیە داوات لێ ئەکات لەوەی کە بەندایەتی بە تەنها بۆ الله بکەیت ، وە وازبهێنی لە بەندایەتی کردن لە هەرچی شتێکە جگە لە الله نەبێت .

④ مەرجی چوارەم : ملکەچ بوون (الإنقياد) :

دەبێت ملکەچ و گوێڕایەڵ بیت بۆ هەر شتێک کە ئەو وشەیە داوات لێ ئەکات .

⑤ مەرجی پێنجەم : ڕاستگۆ بوون لە وتنیدا (الصدق) :

ئەو کەسەی کە دەڵێت لا إله إلا الله دەبێت لە دڵیەوە بەڕاستی بزانێت ، جا ئەگەر هەر تەنها بە زمانی گوتی لا إله إلا الله بەڵام لە دڵیدا بەڕاستی نەئەزانی ، ئەوا مونافق و درۆزنە .

⑥ مەرجی شەشەم : دڵسۆزی و نیەت پاکی (الإخلاص)

دڵسۆزی و نیەت پاکی دەبێتە هۆی پاک کردنەوەی کردەوەکان لە هەموو جۆرە پیسیەکی شیرک ، ئەوکەسەی دەڵێت لا إله إلا الله نابێت هیچ مەبەستێکی هەبێت بۆ هیچ خۆشیەک لە خۆشیەکانی دونیا ، وە نە بۆ بەرچاوی بێت (الرياء) نە بە گوێی خەڵک دابدات (السمعة) .

⑦ مەرجی حەوتەم : خۆشەویستی ( المحبة ) :

دەبێت خۆشەویستەکی تەواوی هەبێت بۆ ئەو وشەیە ، وە خۆشویستنی ئەوانەی ئەهلی ئەم وشەیەن ، وە خۆشویستنی هەموو ئەو شتانەی ئەو وشەیە لەسەرمان پێویست ئەکات .

⑧ مەرجی هەشتەم : کوفر کردن بە هەر شتێک کە لە شوێنی الله ئەپەرسترێت کە پێشتریش زۆر باسمان کردوە، (الكفر بما يعبد من دون الله)
هەرشتێک و هەرکەسێک کە لە شوێنی الله ئەپەرستراو بەندایەتی بۆ ئەکرا دەبێت کافر بیت پێی و باوەڕت پێی نەبێت و بە پووچ و باطلی بزانیت ، وە بەندایەتی و الله پەرستی تەنها بۆ الله بکەیت .

---

ئەووەش هەر هەشت مەرجەکەی لا إله إلا الله کە دامەزرێنەری لا إله إلا الله یە،
پاشان بە جێبەجێکردنی ئەوانە تۆ{لا إله إلا الله}یەکەت دادەمەزرێ،
بەڵام دەبێ بزانی کە تۆ چۆن {لا إله إلا الله}یەکەت دامەزرا ئاواش هەندێک شت هەیە کە پێی {لا إله إلا الله}یەکەت هەڵدەوەشێنێتەوە
ئەوانیش پێیان ئەوترێ هەڵوەشێنەرەوەکانی لا إله إلا الله،
وە محمدی کوڕی عبدالوهابیش هەموو هەڵوەشێنەرەوەکانی لەژێر ١٠ هەڵوەشێنەرەوە کۆکردۆتەوە،
وە دەبێ بزانین ئێمە توشی هەر هەڵوەشێنەرەوەیەک بین (چ بە دڵ بێ ، یاخود بە قسە ، یاخود بە کردەوە) ئەوە پێی کافر ئەبین و لا إله إلا الله یەکەمان هەڵدەوەشێتەوە و دەبێ دیسانەوە شایەتومان بێنینەوە بۆ ئەوەی موسڵمان ببینەوە.

## ئێستا دێینە سەر ١٠ هەڵوەشێنەرەوەکەی ئیسلام:

١_ هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە لە پەرستندا:

ئەم هەڵوەشێنەرە بریتیە لەوەی هەر عیبادەتێک کە شایستەی خودای گەورەیە بە تەنها ، بەڵام بۆ جگە لە خودای گەورە بکرێت کەوتۆتە ناو هاوەڵدانانەوە چونکە خودای گەورە عیبادەت بە مافی خۆی دەزانێت ڕازی نیە بۆ جگە لە خۆی بکرێت.

بەڵگە/ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾

بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت.

سەرچاوەی ئایەت: [النساء ٤٨]

====

٢_ دانانی وەسیلەیەک لە نێوان خۆی و خودای گەورە:

ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە بریتیە لەوەی شتێک بپەرسترێت بکرێت بە وەسیلەیەک لە نێوان خۆی و خودای گەورە بەمە کەوتۆتە ناو هاوەڵادانانەوە.

بەڵگە/ ﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ﴾

کەسانێک دەپەرستن جگە لە خوای گەورە جا نە زیانیان پێ دەگەیەنێت هەروەها نە قازانجیش بەڵکو دەڵێن ئەمانە تکاکارمانن لای خودای گەورە.

سەرچاوەی ئایەت: [یونس ١٨]

====

٣_ بە کافر دانەنانی بێباوەڕ و هاوەڵدانەران:

ئەم هەڵوەشێنەرە بریتیە لەوەی هەر موسڵمانێک کافری بنەڕەتی(وەک یەهود و نصارا و ئاگر پەرستەکان و تا دوایی...) و کافرێک لە پاش باوەڕهێنان هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام(مورتەدبوە) بە کوفر و هاوەڵدانانی گەورە بە کافریان نەزانێت خۆی کافر دەبێتەوە چونکە خودای گەورە لە قورئاندا بە کافری داناون.

بەڵگە/ ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ﴾

بەڕاستی کافر بون ئەوانەی گوتیان خودای گەورە عیسای کوڕی مەریەمە.

سەرچاوەی ئایەت: [المائدة ١٧]

====

٤_ ئەوەی پێی وابێت لە ئیسلام باشتر هەیە:

ئەم هەڵوەشێنەرە بریتیە لەوەی پێی وابێت ئاینێکی تر یان دەستور و یاسایەکی باشتر لە ئیسلام هەبێت یان یەکسان بێت بە ئیسلام ، هەر هەمووی هاوەڵدانانە بۆ خودای گەورە کافر دەبێت چونکە خودای گەورە باشترین دەستور و یاسای ڕەوانە کردوە کە بریتیە لە قورئان و سوننەت.

بەڵگە/ ﴿إِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ﴾

باشترین وتە وتەی خودای گەورەیە باشترین ڕێگا ڕێگای بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ.

سەرچاوەی فەرموودە: [مسلم | ٨٦٧]

====

٥_ ڕق لێبونەوە لە قورئان و سوننەت:

ئەم هەڵوەشێنەرە بریتیە لەوەی هەرکەسێک ڕقی لەوە بێت کە خودای گەورە دایبەزاندووە (ئەگەر کاریشی پێبکا) پێی کافر دەبێت چونکە ڕقلێبوونەوە بەمانای دژایەتیکردنە.

{بۆنمونە: کەسێک ڕیشی هەیە بەڵام ڕقی لە ڕیشە،}

بەڵگە/ ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ - ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾

ئەوانەی کافر بوون لە دونیادا سەرشۆڕیان بۆ هەیە لە ڕۆژی دواییدا کردەوەکانیان بێ ئاکامە-لەبەر ئەوەی ڕقیان لەوە بۆتەوە کە خودای گەورە دایبەزاندووە جا کردەوەکانیان پوچبوونەوە.

سەرچاوەی ئایەت: [محمد ٨-٩]

====

٦_ گاڵتە کردن بە قورئان و سوننەت:

ئەم هەڵوەشێنەرە بریتیە لەوەی هەر موسوڵمانێک گاڵتە بە هەر شتێک لە شتەکانی خودای گەورە کە دایبەزاندووە بیکات کافر دەبێت و عوزری بۆ نیە ، تەنها ئەوانە نەبێت کە جهلیان هەبوە (نموونە نەیزانی ئەمە سوننەتە) بەڵام دەبێت تەوبەی لەسەر بکات.

بەڵگە/ ﴿قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ-
لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ﴾

بەوانە بڵێ کە گاڵتەیان بە خودای گەورە و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی کرد-عوزر مەهێننەوە کافر بوون لەپاش ئەوەی باوەڕتان هێنابوو.

سەرچاوەی ئایەت: [التوبة ٦٥-٦٦]

====

٧_ باوەڕهێنان بە جادوو ساحیرەکان:

ئەم هەڵوەشێنەرە بریتیە لەوەی هەر موسوڵمانێک باوەڕ بە شتێک لە شتەکانی ساحیرەکان بهێنێت یان بەڕاستیان بزانێت لە هەندێک بابەتدا کافر دەبێت بەو قورئانەی بۆ پێغەمبەر ﷺ رەوانەکراوە.

بەڵگە/ ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡۖ﴾

کەسیان فێرە سیحر نەدەکرد تا پێیان دەگووت ئێمە بۆ تاقیکردنەوە لێرەین خۆت کافر مەکە.

سەرچاوەی ئایەت: [البقرة ١٠٢]

====

٨_ پشتیوانی کردنی کافران دژی موسوڵمانان:

ئەم هەڵوەشێنەرە بریتیە لەوەی هەر موسوڵمانێک کافرێکی خۆش بوێت لە پێناو کوفرەکەی بێگومان کافر دەبێت،

نموونە: بۆنموونە ئیسرائیل و غەزە شەڕئەکەن ، یان ئەمەریکا و گروپێکی موسڵمان ، تۆ پێت خۆشە ئەو کافرانە بەسەر موسڵمانان سەربکەون و موسڵمان لێی بکوژرێ و ئەزیەت بدرێ ، ئەوە پێی کافر ئەبێ و لەدین دەرئەچی)،

بەڵگە/ ﴿۞يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکە و گاور مەکەنە پشتیوانتان چونکە هەندێکیان پشتیوانی یەکترن جا ئەوەی پشت بەوان ببەستێت حیسابی ئەوانەی بۆ دەکرێت.

سەرچاوەی ئایەت: [المائدة ٥١]

====

٩_ باوەڕبوون بەوەی بۆت هەیە لە ئیسلام بچیتەدەر:

ئەم هەڵوەشێنەرە بریتیە لەوەی هەر موسوڵمانێک بڕواتە سەر هەر ئاینێکی تر یان ڕێبازێکی تری کوفری پێی کافر دەبێت بە بێ گومانی.

بەڵگە/ ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾
ئەوەی شوێن هەر ئاینێکی تر بکەوێت جگە لە ئیسلام لێی وەرناگیرێت و لە ڕۆژی دوایی لە خەسارەتمەندانە.

سەرچاوەی ئایەت: [ال عمران ٨٥]

====

١٠_ پشت کردن لە ئیسلام و ڕێبازەکەی:

ئەم هەڵوەشێنەرە بریتیە لەوەی هەر کەسێک پشتی لە ئیسلام کردبێت لە پاش ئەوەی زانیبووی شوێن دونیا بکەویت لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە.

بەڵگە/ ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآۚ إِنَّا مِنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾
کێ لەوە ستەمکار ترە بە ئایەتەکانی خودای گەورە ئامۆژگاری کرابێت لە پاشاندا پشتی تێکردبێت بەڕاستی تۆڵە لە ستەمکاران دەستێنین.

سەرچاوەی ئایەت: [السجدة ٢٢]

**ئەوەش بەشەکانی (لا إله إلا الله) ، لێرەدا زانیمان کە چۆن لا إله إلا الله یەکەمان دائەمەزرێ و چۆنیش هەڵدەوەشێتەوە.**

## (٣٤) ئێستا بابێینە سەر محمد رسول اللهﷺ و بزانین چۆن محمد رسول اللهﷺمان لێوەرەگیرێ:

محمدﷺ مرۆڤێکە خودای گەورە هەڵیبژاردوە بۆ پێغەمبەرایەتی بۆ گەیاندنی ئاینی ئیسلام ، کۆتایەمین پێغەمبەر و گەورەترین پێغەمبەری خودایە ، لەدایکبوونەکەی گەورەترین موعجیزەبوو ، باشترین کتێبی پێدراوە کە قورئانە ، یەکەم کەسە زیندوو ئەکرێتەوە و یەکەم کەسە ئەچێتە بەهەشتەوە ، هەرگیز تاوانی نەکردوە و شایستەترین مرۆڤە بۆ شوێنکەوتن.

شێخ ئەلبانی ئەفەرموێ:
چۆن هیچ خودایەک نیە بەحەق جگە لە الله ، بەهەمان شێوە هیچ کەسێک نیە شایستەی ئەوەبێ شوێنی بکەوی جگە لە محمد رسول اللهﷺ. [شریط متفرقات | ١٧٥]

## مەرجەکانی محمد رسول الله پێکهاتووە لە ٤ مەرج:

١ـ گوێڕایەڵیکردن بەوەی فەرمانی پێکراوە/

دەبێ گوێڕایەڵی بکەین لەو شتانەی کە فەرمانی پێکردوە و بەڕاستی بزانین و کاری پێبکەین.

٢ـ بەڕاست دانانی ئەوەی پێی ڕاگەیاندراوە/

دەبێ بەڕاستی بزانین کە پێغەمبەرە و نێردراوی الله یە و دەبێ پەیامەکەی بەڕاست بزانین و ملکەچی هەموو فەرمان و نەهیەکانی بین.

٣ـ دوورکەوتنەوە لەو شتانەی قەدەغەی کردوە/

دەبێ لە هەموو ئەو شتانە دورکەوینەوە کە پێغەمبەرمان نەهی لێکردوە و فەرمانی پێمانکردوە کە لێی دورکەوینەوە.

٤ـ الله نەپەرسترێت تەنیا بە شەرع نەبێت/

واتە دەبێ موسڵمان دوربێ لە هەموو داهێندراوێک لە دین و کەمکردنێک لە دین، تەنیا و تەنیا ئەوانە جێبەجێ بکا کە فەرمانی پێکراوە.

(٣٥)

# ئامانجەکانی محمد رسول اللهﷺ

**بۆ دوو ئامانجی سەرەکی نێردرابوو ئەوانیش:**

**١- گەیاندنی یەکخوا پەرستی،**

**بانگەوازکردن بۆ ڕزگاربوون لە بەندایەتی بەندەکانەوە بۆ بەندایەتی خودا،**

**بەڵگە/ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ [النحل ٣٦]**

**٢- گەیاندنی ئیسلام وەک خۆی،**

**بانگەوازکردن بۆ گەیاندنی شەرعی الله وەکو خۆی بەبێ زیاد و کەمی بە شێوەیەکی مامناوەن،**

**بەڵگە/ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا [المائدة ٣]**

**ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەم بۆ تەواوکردن و ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواوکردن و ڕازیم بەوەی ئیسلام دینتانبێ.**

**ئێستاکە زانیمان رسول الله ﷺ بە چ ئامانجێک نێردراوە، وە بە کردەوە پێکردنی ئەم خاڵانەی سەرەوە محمد رسول اللهﷺمان تەواو ئەبێ و داخیلی ئیسلام ئەبین.**

## (٣٦) لێرەدا لە محمد رسول الله ﷺ و مانایەکانی گەیشتین ، ئێستاکە دێینە سەر دووەم پایەی ئیسلام کە زۆر پێویستە باسکرێ ئەویش (نوێژە)

نوێژ لەدوای پایەی یەکەمی ئیسلام (کە دوو شەهادەکەبوو) گرینگترین پایەیە لە ئیسلام ، بەڵگە زۆرە لەسەر ئەوەی هەرکەسێک نوێژ تەرک بکا ئەوە کافرە و هیچ بەشێکی لە ئیسلامدا نامێنێ: بەڵام ئێمە بەکورتی چەند بەڵگەیەک دێنینەوە إن شاء الله لە قورئان و فەرموودە و وتەی زانایان...

**١- الله تعالی ئەفەرموێ:**

فإن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فإخوانكم في الدين [التوبة ١١]

واتە: خودا ئەفەرموێ بە ئیمانداران ، ئەگەر کافرەکان تۆبەیانکرد و ئیمانیان هێنا و نوێژەکانیان کرد و زەکاتیاندا ئەوە براتانن لە دین، (زانایان ئەفەرمون ئیمان هێنان و نوێژی پێکەوە بەستۆتەوە و کردۆتیە مەرجی موسڵمانبون، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نوێژ نەکەر کافرە)

**٢- الله تعالی ئەفەرموێ:**

فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ{٣١}

کاتێک کافرەکان لە ڕۆژی قیامەت بۆ لای پەروەردگاریان ڕاپێچ ئەکرێن ئینجا پێیان ئەوترێ ، نە ئیمانی هێنا و نە نوێژێکی بەجوانی ئەنجامدا ،

وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ{٣٢}

بەڵکو بڕوای نەهێناو پشتی تێکرد

**٣- پێغەمبەرمان ﷺ ئەفەرموێ:**

إنَّ بيْنَ الرَّجُلِ وبيْنَ الشِّرْكِ والْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاةِ [مسلم ٩٨٧]

لە نێوان پیاو و شیرک و کوفردا وازهێنانە لە نوێژ.

٤- پێغەمبەرمان ﷺ ئەفەرموێ:

العهدُ الذي بينَنا وبينَهم الصلاةُ، فمَن تركَها فقد كفرَ

[ترمزي ٢٦٢١ ، نسائی ٢٣١ ، ابن ماجه ١٠٧٩]

٥- عبدالله ـی کوڕی شقیق کە یەکێکە لە تابعین ئەفەرموێ:

حابە هیچ شتێکیان وەکو وازهێنان لە نوێژ بە کوفر نەدەزانی، [شێخ ئەلبانی لە (صحيح الترغيب و الترهيب)ـدا باسیکردوە]

٦- عمری کوڕی خطاب ئەیفەرموو:

ئەوەی واز لە نوێژکردن بێنێ هیچ بەشێکی لەو ئیسلامەدانیە(واتە لە ئیسلام دەرچوە)

وە ئەوە بۆچونی علي کوڕی ابو طالب و معاز و ابو درداء و عوبادەی کوڕی سامیت و ابن مسعودە [صحيح الترغيب و الترهيب | ٥٧٣]

٧- سعدی کوڕی جبیر ئەفەرموێ:

هەرکەسێک نوێژ تەرککا بەیەکجاری ئەوە کافربوە [تعظيم قدر الصلاة | ٩١٩]

٨- ابن عباس ئەفەرموێ:

هەر موسڵمانێک نوێژ تەرك بکات ئەوە کافربوە[تعظيم قدر الصلاة | ٣١٩]

٩ - علی کوڕی ابي طالب دەربارەی نوێژ ئەفەرموێ:

ئەوەی نەیکات کافرە [تعظيم الصلاة المروزي | ٢/٨٨٩]

١٠- ابن تیمیە ئەفەرموێ:

نوێژنەکەر لە دز و زیناکار و مەشروبخۆر خراپترە [مجموع الفتاوى | ٢٢/٥٠]

ئێستا زانیمان کەسێک واز لەنوێژ بێنێ کافرە و حوکمی پایەی دووەم یشمان زانی

(٣٨)

وە سێ پایەکەی دیکەش حەزم لێنیە زۆر لەسەری بڕۆم

بۆیە بەکورتی باسی ئەکەم...

## سێیەم پایەی ئیسلام زەکاتە:

مرۆڤی موسڵمان پێویستە ئەگەر لەتوانایدابوو هەموو ساڵێک زەکاتی ماڵەکەی بدات

بە یەکێک لەو ٨ کۆمەڵەی کە لە قورئاندا باسکراوە،

بۆ زیاتر زانیاری وەرگرتن بڕۆنەوە سەر سورەی [الأعراف ١٥٦ ، التوبة ٦٠]

## چوارەم پایەی ئیسلام ڕۆژووە:

مرۆڤی موسڵمان لەسەری واجبە کە هەموو ساڵێک کە ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان بگرێت ، تەنیا

بۆکەسێک نەبێت کە عوزرێکی شەرعی هەبێت،

بۆ زیاتر زانیاری وەرگرتن بڕۆنەوە سەر سورەی [البقرة ١٨٣ ، البقرة ١٨٧]

## پێنجەم پایەی ئیسلام کردنی حەجی ماڵی خودایە:

واتە واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێک کە لەهەموو ژیانی جارێک حەجی

ماڵی خودا بکات ئەگەر لەتوانایدا هەبوو، (وە عەمرەش هەمان حوکمی

هەیە،

بۆ زیاتر زانیاری وەرگرتن بڕۆنەوە سەر سورەی [البقرة ١٩٦ ، الحج ٢٧]

(٣٩)

## ئێستا دێینە سەر پلەی دووەم کە ئیمانە:

ئەویش وەکو پێشتر باسمانکرد لە ٦ پایە پێکهاتوە بەکورتی إن شاءَ الله باسی ئەکەین،

### ١- باوەڕبوون بە خودا:

دەبێ باوەڕی تەواوت بە الله هەبێ وەکو چۆن پێشتر باسمانکرد لە ئیسلامدا و لە باسی لا إله إلا الله ، دەبێ باوەڕت بەبونی هەبێ و باوەڕت بەوەبێ کە هیچ شرکێکی نیە لە هەموو جۆرەکانی تەوحید و باوەڕت بە هەموو ناو و سیفاتەکانی هەبێ بەبێ زیاد و کەم

### ٢- باوەڕبوون بە فریشتەکان:

دەبێ باوەڕت بە هەموو ئەو فریشتانە هەبێ کە لە قورئان و سوننەت باسکراوە ، ئەوانەی ناویان هاتوە و ناویان نەهاتوە ، دەبێ باوەڕت بە هەموو ئەو سیفاتانەیان هەبێ کە باسکراوە لە قورئان و فەرمودەدا ،(وەکو چۆن لە فەرمودەدا هاتوە کە جبرائیل ٦٠٠ باڵی هەیە)، تۆ ئەبێ باوەڕی تەواوت پێی هەبێ ، وە باوەڕ بەو ئەرکانەبێ کە پێیان سپێردراوە ، بۆنموونە: میکائیل فریشتەی بارانبارینە و ئەرکی ئەوەیە ، جبرائیل فریشتەی وەحی بوە و تا دوایی...

### ٣- باوەڕبوون بە کتێبە ئاسمانیەکان:

بریتیە لەوەی باوەڕت هەبێ بە هەموو ئەو کتێبانەی لەلایەن خوداوە دابەزیوە و نێردراوە ، بەوانەی ناویان هاتوە(وەکو: قورئان و تەوڕات و ئینجیل و زەبوڕ و صوحوف)، و ئەوانەی ناویان نەهاتوە ، و بەڕاست دانانی ئەوانەی کە لەناویاندا هاتوە ، و دەبێ بزانی لەدوای دابەزینی قورئان ئەو کتێبانەیتر هیچی کاری پێناکرێ...

## ٤- باوەڕبوون بە پێغەمبەرکان:

بریتیە لەوەی باوەڕت بەتەواوی ئەو پێغەمبەرانە هەبێ کە نێردراون لەلایەن الله وە ، بەوانەی کە ناویان هاتوە و بەوانەی ناویان نەهاتوە ، وە دەبێ باوەڕت بەو چیرۆک و ڕوداوانە هەبێ کە دەربارەیان هاتوە لە قورئان و فەرمودە و کارکردن بەو شەریعەتەی کە بۆ پێغەمبەر محمد ﷺ نێردرا.

## ٥- باوەڕبوون بە ڕۆژی دوای:

بریتیە لە باوەڕبوون بە گۆڕ و ئەوەی لەناوی دایە لە سزا و لە پاداشت ، باوەڕبون بە بەرزەخ و زیندوبونەوەی دوای مردن و هەموو ئەو پاداشت و سزایانەی لە ئایەت و فەرمودەدا هاتوە و باوەڕبون بە بەهەشت و دۆزەخ...

## ٦- باوەڕبوون بە قەدەری خێر و شەڕ:

باوەڕبون بە قەدەری خێر و شەڕ:

بریتیە لە باوەڕبون بەوەی کەس لە زانستی شاراوە نازانێ تەنیا خودا نەبێ و باوەڕبون بەوەی ئەو شتانەی ئەیکەین هەمووی لە لوح المحفوظدا نوسراوەتەوە(لوح المحفوظ کتێبێکە کە لەلای خودای گەورەیە و هەموو شتێکی لێ نوسراوەتەوە لە ئەوەڵی دروستکردنی بونەوەراتەوە تاوەکو کۆتایی بونەوەرات و کۆتایی دنیا )، وە باوەڕبون بەوەی کە خێر هەر لەلایەن الله وەیە و شەڕیش هەر لەلایەن الله وەیە، و بەسوپاس گوزاری لەسەر خێر و خۆشیەکانی لێی نزیک ئەبینەوە و بە صبرگرتن و شوکرانە بژێری لەو کاتەی تاقیمان ئەکاتەوە پێی نزیک ئەبینەوە لە الله

# ئەمەش شەش پایەکەی ئیمان

## ئێستاش دێینە سەر پلەی سێیەم کە ئیحسانە:

## ئیحسان لە دوو بەش پێکهاتوە:

### ١ـ أن تعبد الله كأنك تراه:

بریتیە لەوەی لەکاتی عبادەتەکانت و خودا پەرستیەکانت ئاوا خودا بپەرستی وەکو ئەوەی کە خودا ببینی لەکاتی عیبادەتەکانت (ئەوەندە بەجوانی و ڕێک و پێکی و بە ئاگاییەوە خودا پەرستی ئەکەی)،
ئەم خاڵەیان بەزۆری صحابە و سەلەف و بەشێکی کەم لە بەندەکانی ئەم سەردەمە لەناو ئەو دەرەجەیە بەرزەدان ، بۆیە ئەبینی کاتێک ژیانی سەلەف و پێشینەی خۆمان ئەخوێنینەوە یاخود گوێمان لێی ئەبێ وەکو خەیاڵێک وایە لامان کە ئەوانە چۆن ئاوا بەو دەرەجە بەرزە خودایان پەرستوە، (ئەم دەرەجەیە پێویستی بەیەکێکە کە تەواو خۆی بۆ خودا یەکلایی بکاتەوە دوربێ لە هەموو تاوان و بێفەرمانیەکی خودا کە ئەنجام دەدرێ ، کەسێکبێ کە بە بەردەوامی لەناو زکر و یادی الله بێ ، بەم شێوەیە دەگاتە ئەوپەڕی دەرەجەی بەرزی ئیحسانە

### ٢ـ فإن لم تكن تراه فإنه يراك:

بریتیە لەوەی ئەگەر تۆش خودات نەبینی وەکو ئەوە وایە کە خودا تۆ ببینێ ، تۆ سەیرێکی خۆتکە کاتێک کارێک ئەکەی بۆ کەسێک و هەستەکەی ئەتبینێ چۆن جوانتر و ڕێک و پێکتر کارەکەت ئەکەی...
ئەم دەرەجەیان بەگشتی زۆرینەی خەڵکی ئەتوانن بیگەنێ ، بەڵام گەر خۆڕاگر و زاڵنەبی بەسەر حەز و ئارەزوەکانت و دورنەکەویەوە لە تاوان ئەوە کاتیە و چێژی ئیمانیشت کاتی ئەبێ.

بەم جۆرە هاتینە کۆتایی هەرسێ بەشەکەی

دین(کە ئیسلام و ئیمان و ئیحسانبوو).

## (٤٢) وە سێیەم پسیار کە لێت ئەکرێ لەناو گۆڕەکەت بریتیە لە (من نبیك) پێغەمبەرەکەت کێیە:

وەکو پێشتر باسمانکرد تۆ بۆ ئەوەی محمد رسول الله ت دابمەزرێ ئەبێ شوێنی بکەوی و شوێن یاسا و بەرنامەکەی بکەوی ، پاشان لێرەدا بە پوختی بەشێک لە ژیاننامەی باسەکەین و دێینە سەری چون تۆ بۆ ئەوەی بڵێی پێغەمبەرم محمد بوە ﷺ ئەوە دەبێ یەک شوێنی بەرنامە و ڕێبازەکەی کەوتبی ، دوو: پێویستە بەشێکی کەمیشبێ شارەزاییت هەبێ لە سیرە و ە ژیاننامەکەی ، لێرەشدا بە کورتی هەندێکی باسەکەین:

ناوی محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالمطلبی کوڕی قاسم بوە ، و لە نەوەی پێغەمبەر ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە(سەلامی خودایان لەسەربێ)

لە ساڵی ٥٧١ زاینی لەدایکبوە کە ناسراوە بە ساڵی فیل

دایکی ناوی ئامینەی کچی وەهابە

پێغەمبەرمانﷺ ٦٣ ساڵ ژیاوە

لە پێش لەدایکبونی باوکی کۆچی دوایی کردوە و پاشان لەلای دایکی پەروەردە بوە ، لە تەمەنی ٦ ساڵی دایکی کۆچی دوایی کردوە و لەلای باپیرەی پەروەردە بوە ، وە پاشان لە تەمەنی ٨ ساڵی باپیری کۆچی دوایی کردوە و لەلای مامی ئەبوو طالب گەورەبوە،

لە تەمەنی ٢٥ ساڵی هاوسەرگیری لەگەڵ خەدیجەی کچی خولەید کردوە،

لە تەمەنی ٤٠ ساڵی وەحی بۆ هات و بوە بە پێغەمبەر،

بە پێنج ئایەتی سەرەتای سورةی العلق بوو بە نەبی (النبي)

بە سورةی المدثر بوو بە ڕەسول (الرسول)

٢٣ ساڵ دعوەی پێغەمبەرایەتی کرد ، ١٣ ساڵ لە مەکە ، ١٠ ساڵ لە مەدینە،

لەمەککە ٣ ساڵی سەرەتا دعوەی بە نهێنی ئەکرد ، وە ١٠ ساڵیش بە ئاشکرا ،

٣ کوڕ و ٤ کچی هەبوە ، سێکوڕەکەی هەر لە تەمەنی منداڵیدا مردون،

(٤٣)

کوڕەکانی:

١- قاسم

٢- عبدالله

٣- ئیبراهیم

کچەکانی:

١- زەینەب

٢- ڕوقیە

٣- ئوم کەلسوم

٤- فاتیمە

١٢ مام و ٦ پوری هەبوە ،

لە هەموو مامەکانی ٢ مامی ئیمانیان پێهێنا ئەوانیش إمامی حەمزە و عەبباس بوون.

الحمدلله💚

وە لێرەدا کۆتایی بە نامیلکەکەمان

دەهێنین و داواکارین لە الله تعالی بە

إخلاصەوە لێمانی وەرگری و عاقیبەت

خێرمانبکا و بەبێ شرک و بە تەوحیدێکی

خالص و دور لە هەموو شرک و کفر و

ریاییێک بگەڕێینەوە بەردەمی و

فیردەوسی اعلامان بەنسیب بکا.

{وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين}.

اللهم امين❤️

نووسینی: ابو عائيشة الكردية